| شیعر |

# ژنێک ژیانی گۆڕیم

محسن شوانی



ناوی کتێب – **ژنێک ژیانی گۆڕیم**

ناوی نووسەر – **محسن شوانی**

بابەت – **شیعر**

دیزاین – **محەمەد جەهار**

ساڵی چاپ – **٢٠٢٢**

نۆبەتی چاپ – **چاپی یەکەم**

چاپخانە - **چوارچرا**

تیراژ- **٥٠٠ دانە**

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی(١٢٦) ساڵی (٢٠٢٢) ی پێدراوە.

# پێڕست

# پێشەکی

بەنـاوی خـوای بەخشـندەی میهرەبـان، کـە بەرەکەتـی عەشـق لەلایـەن ئـەوەوە بـەر دڵـەکان هیدایـەت کـراوە،

ئـەم کۆمەڵـە شـیعرەی بـەر دیدەتـان (ژنێـک ژیانـی گۆڕیـم) بەرهەمیـکی نوێـی شـاعیر موحسـین شـوانییە، کـە ناوەرۆکەکـەی عەشـقە، دوونیایـی خوێنـەر بـۆ چەنـد چرکەسـاتیك بـە خوێندنـەوەی دوور دەکەوێتـەوە لـە هەواڵـی ناخـۆش و خەمەکانـی ئـەم ڕۆژگارە جەنجاڵـە، خۆشـحاڵم کـە بتوانـم لـە ئاسـتی ئـەوە دابـم و پێنووسـەکەم چەنـد دێرێـك دەربـارەی شـیعر و بەرهەمـە بـە پێزەکـەی ئـەم شـاعیرە گـەورە بنووسـێت. موحسـین شـوانی شـاعیر، نووسـەر، ڕۆژنامـە نـووس، هونەرمەنـد، ڕاگەیانـدکار و مامۆسـتا.

سـەلماندوویەتی کـە لەگـەڵ ئـەو هەمـوو بـارو دۆخـە ناهەمـوارەی ژیانـی خـۆی و کۆمەڵگاکـەی کـە لـە رابـردوو تێـی پەڕانـدووە، هەمیشـە لـە کۆشـش دا بـووە بـۆ کارە هونەریەکانـی و شـیعر و بـە تایبـەت لـە کاری ڕۆژنامەوانیـدا کـە ئەزمـوونی سـەخت و دژواری تێپەڕانـدوە، بـەڵام هیـچ یـەك لـە مانـە نەیتوانیـوە ڕێگـری بێـت لـە بـەردەم ئامانجەکانیـدا،

ئـەم جـارەش شـاعیر بەرهەمێکـی جیاوازتـر بـە شـیعرە پـڕ لـە میهـر و سـۆزی عاشـقانەی دوونیایـی ئـەدەب و هونـەری شـاعیرانی ڕازاندۆتـەوە، پێشـتریش نـۆ بەرهەمـی تـری شـیعری خسـتۆتە بـەر دیـدی خوینـەران مـن بـەش بەحاڵـی خـۆم لـەو کاتـەوە شـیعرەکانم خوێندۆتـەوە زۆر بـە دڵـم بـووە، بەراسـتی بـۆن و بەرامـەی شـیعریان لـێ دێـت و شـیعرەکان هەسـت بزوێنـن و خەیاڵـی ناسـك و هەسـتی عاشـقانە و ئەزموونـی شـاعیرانەی تیـادا بـەدی دەکرێـت.

هـەر شـاعیرێك شـێوازی زمانـی شـعری جیـاوازە، موحسـین شـوانی لـە دوونیـای شـعرەکانیدا لەگـەڵ عەشـقەکەی دەبینیـت کـە لـەو دیـوی شـیعرەکانیەوە ڕێـزی لـە شـکۆی ژن گرتـووە بـە دیـاری و بەخشـشێکی خوایـی نـاوی هینـاوە.

ئەوانـەی لـە دوونیـای شـیعردا دەژیـن پێویسـتیان بەوەیـە رۆحیـان تـازە بێتـەوە، وابزانـم کـەم کـەس هەبـێ خولیـای شـیعر نەبـێ، مـن پێـم وایـە شـیعری عاشـقانە دوونیامـان ڕەنگیـن تـر و خۆشـحاڵیەکانمان زیاتـر و خەمەکانمـان سـوکتر دەکات، ئارەزووەکانمـان بەدیهینـتر دەکات.

شـیعر پـڕ بەهاتریـن میراتـە کـە لـە کۆنـەوە بـۆ ئێمـە بەجـێ مـاوە، باشـترینە بـۆ دەربڕینـی گریـان و پێکەنیـن، شکسـت و سـەرکەوتن و خۆشـحاڵی و ناکامیـەکان، موحسـین شـوانی

یەکێـك لـە شـاعیرانی ئەم سـەردەمەکە بەهـۆی شـێوازی تایبەتی و ئاسـان زمـانی لـە شـیعرەکانیدا خۆشەویسـتی و ڕێـزی خـۆی هەیـە لـە نێـو خوێنەرانیـدا، بـە تایبەتـی ئـەم بەرهەمـەی جیـاوازە لـە شـیعرەکانی ڕابـردووی، جوانیەکـەی لـەوە دایـە کـە عاشـقانە و نـەرم و تـەڕن رۆحـی تەمەننـا و عەشـق و ئارەزوومەنـدی و دابـڕان لـە نـاو شـعرەکانیدا شـەپۆل دەدات .

شـعیری (یـەك دڵ، کیمیایـی عەشـق، خۆزگـە، ژن) بـە خوێنـەر دەڵـی کـە شـیعرەکانم هەڵقـوڵاوی دڵمـن، بـە هەسـت و سـۆزی دڵ دەیاننوسـم، بەزمانێـکی پـاراو و سـادە ووشـەکان ڕیـز دەکات خوێنـەر دەخاتـە نـاو دونیایـی خەیـاڵ و پـڕ تابلـۆی جـوان و ڕەنـگاو ڕەنـگ، جگـە لـەوەی شـاعیر خـۆی مۆسـیقار و هونەرمەنـدە ئـاواز و ڕتمێـکی ناسـك و جـوان بـە ووشـە بەخشـیوە بـە شـیعرەکانی، زۆربـەی شـیعرەکان بـە چـوار بڕگـەی ڕازاندۆتـەوە خوێنـەر مانـدوو ناکـەن و ئاسـان و خۆشـن بـۆ گۆرانـی بۆیـە وەك ئـاگادارم پێشـتریش زۆر لـە شـیعرەکانی کراوەتـە گۆرانـی، خـۆی ئـاوازی بـۆ دانـاون ئەمـەش جیاوازیـەکی تـری موحسـین شـوانییە.

مەولانـا دەربـارەی عەشـق دەڵـێ: عەشـق شـتێك غەیـری دەرخسـتنی میهـر و موحیبـەت نـی یـە، عەشـق واتـە ئاسـانکردن و لابردنـی خەمێـك، دەرمـان کردنـی دەردی دەردەدارێـك.

عەشق واتە دەشتێك پڕ لە گوڵ و گوڵزار لە بیابانێکدا ڕووبارێکی زووڵاڵ و ڕەوان، هەرکارێکی باش کە دەمێنێتەوە جێ پەنجەی عەشقی تیا دەبینرێتەوە. شیعری عاشقانە کۆنترین ڕێگای شیعر وتن بووە، بۆیە شاعیران هەر لە کۆنەوە گرینگیان پێداوە، شیعر بۆ خۆی بوونێکی عاشقانەی هەیە،کاتێك لەگەڵ لایەنی عەشق یەکدەگرن ناسکترین هەستی هەردوو دوونیا لەگەڵ یەکتر تێکەڵاو دەکەن، ئەمە ئاڵۆزترین و قوڵترین ئیحساسی مرۆڤانەیە کە ئەوەندە تاك و بێوێنەیە، تاوەکو ئێستا کەس نەیتوانیوە مانایەکی دروست بۆ عەشق بدۆزێتەوە،کەچی دەتوانین بڵێین زۆربەی خەڵك لەم هەستەیان ئەزموون کردووە، بۆیە کتێب و شعر و گۆرانی و ئەدەبیاتی عاشقانەمان پێخۆشە.

عەشق دوو جۆرە عەشقی مەعنەوی ئیلاهی، عەشقی زەمینی ئینسانی، عەشقی ئینسانی بریتیە لە هەموو خواست و داواکاریەکانی لایەنی هەست و ئارەزوو ڕۆحیەکانی.

عەشقی ئیلاهی سارێژە لە سەخاوەت، مرۆڤدۆستی و خێرخوازی، زۆربەی مرۆڤەکان کە لەم عەشقی ئینسانی سڵ دەکەنەوە، وا بیر دەکەنەوە کە بایەخی کەمە، عەشقی مەعنەوی پلەی بەرزی هەیە، لە حاڵێکدا ئەمانە

بێخەبـەرن، ئاخـر تـا خواسـت و داواکارییـەکانی ڕۆحـی و عاتیفـی جەسـتەیی خـۆت نـەزانی ناتـوانی بگەیتـە عەشـقی مەعنـەوی بـە زمانێـکی پاراوتـر، تـا مرۆڤـەکان نەگەنـە قۆناغـی خۆناسـین ناگـەن بـە قۆناغـی خودانـاسی.

پرسـیار ئەوەیـە بۆچـی پەیوەندیـەکی عاشـقانەی ڕاسـتەقینە پیرۆزترین و قۆرسـترین کاری دونیایـە؟!

ڕاسـتە عەشـق کتوپـڕ درووسـت ئەبێـت بـەڵام چەنـد ماوەیـەک دەخایەنێـت تـا ئـەو پەیوەندیـە دەگاتـە مـەرام، عەشـق دوو کـەسی ئاقـڵ و تێگەیشـتووی دەوێـت. تێگەیشـتنی بیـر و لایـەنی هەسـت پێویسـتە. خاڵـی متمانـە بەخۆبـوون و باوەڕبـوون بەخۆبـوون لاواز بێـت هـەردەم هەسـت بـە دڵەڕاوکـێ و دوودڵـی و تـرس و گومـان دەکەیـن.

عەشـق سنوور و حورمـەتی خـۆی هەیـە، یاریکـردن بـە هەسـت و دڵـی مرۆڤـەکان هەرگیـز عەشـق نییـە، عەشـقی ڕاسـتەقینە بـەو مانایەیـە بتوانیـت ڕێـژەی سـەلامەتی و ئاسـایش و ئارامـی و خۆشـبەختی کەسـی بەرامبـەرت زیاتـر بوێـت لەخـۆت، عەشـق واتـە تـا ئەبـەد مانـەوە.

پەیوەنـدی نێـوان ڕووح و خـودا لەسـەر بنەمـای عەشـقە لـە هـەر شـوێنێك عەشـقێکی پـاك هەبێـت هیچ جـۆرە نەفرەتێکی لـێ نییە.

حزووری خودا لە هەر پێکەنینێک لە هەرگریانێک لە هەر فرسەتێك لە هەر تێڕوانینێك لە هەر کارێك کە دەتانەوێت بیکەن بۆ ئێوەی خوێنەری خۆشەویست ئاواتەخوازم .

دەمەوێ ئەوە بەبیرخوێنەران بهێنمەوە مەرج نییە هەمووشیعرەکانی ئەم کتێبە ئەزموون و عەشق و باسی خودی شاعیربێت چونکە لەهەندێ شیعردا لەبری ژنەکان قسەدەکات بەرگری دەکات، بەتایبەتی کە تیشك دەخاتە سەر مەینەتیەکانی ژنی کورد و ئەو ستەمەی لێ کراوە لەچوارچێوەی داب ونەریتی کۆمەڵگا، لە کۆتاییدا ڕەنج و ماندووبوونی ئەم شاعیرە گەورە بەرز دەنرخێنم، دروود بۆ قەلەمە جوانەکەی دەنێرم.

سەرگوڵ حوسێن زادە

## ژن

تۆ بەهاری
بۆ پایزی دڵەکەی من
ئەی جوانترین بەخششی خوا
ئەی فریشتە
لەوێنەی ژن!

## پێشوازی

تۆ بەس وەرە
من لەبری ڕایەخی سوور
دڵی خۆمت بۆ ڕادەخەم
لەم دیدارە
چیم لێت ناوێت
هەر دڵسۆزیت بۆ دەردەخەم
ئەگەر هاتی
ئاگاداربە!
پێڵاوەکەت با پاژنەکەی
زۆر تیژ نەبێت
لەپێشوازی هاتندا
با لەدڵم توند ڕانەچێت!

## سەرۆکی عەشق

گەرچی لەپێش چاوی خەڵکی
لەسەرکورسی دەسەڵاتی
عەشقم وونی
کۆشکی پاشای ئەویندای
هەر لەخۆت دێ
تۆ شاژنی
حکومڕانی مەملەکەتی دڵی منی!

٢٠٢١/٧/٢٤

## ئازاری ژن

من دەمەوێ لەباوەشی پیاوێکی تر بتبینمەوە
تا هەست بکەم
چەندە سەختە ئازاری ژن
کاتێ پیاوێك
لەئامێزی ژنێکی تر دەمێنێتەوە!

٢٠٢١/١٠/٢٩

## یەك دڵ

لەگەڵم بە
بێ دوودڵی
لەگەڵ مندا بمێنەوە
تا لەعەشقی راستەقینەی یەکتریدا
دەتوێینەوە
ئەوسادەبین بەیەك دڵ و
دووجەستەکۆدەبینەوە

## کیمیایی عەشق

من بووم بەتۆ
تۆش بووی بەمن
من وتۆی چی
هەردووکمان یەك
کە دووتوخم دەسووتێن و
دەتوێنەوە
دوونامێنن
دەبن بەیەك!

٢٠٢١/٢/٢١

## بسك و ڕیش

هەزارویەك هۆنراوەت بۆ دەهۆنمەوە
وەك ئەو دایکە میهرەبانەی
هێدی هێدی
پرچی کچە نازدارەکەی دەهۆنتەوە
ماندوونابم نازت دەگرم
تا بسکی تۆ وەك ڕیشی من سپی دەبێت
وشەی جوان و
پڕ مانا بۆ عەشقی پاکت دەڵێمەوە
بێزارنابم لەباسی تۆ
تا ئەو ڕۆژەی لەزاردەبم
لەدوورەوە
سەردوولکەی مەرگم بۆ دەڵێیتەوە!

## ژن

تا شکۆی ژن
لەجوانیدا هەڵسەنگێنن
قەد لەمانای میهرەبانی
دایکایەتی ڕانامێنن!

## ئیرەیی

کە ڕەشەبا توند هەڵدەکات
زۆر دەترسم
تاڵی قژت بشێوێنێ
کە بارانیش نمە دەکات
ئیرەییم دێ
بەرووتا ماچ ببارێنێ

٢٠٢١/٨/١

## شاژن

من و نالی
عەودالی دوو حەبیبەین
گەر حەبیبەکەی نالی خێلە
حەبیبەکەی من
شاژن وسەرخێڵە.

## خۆزگە

من ژنێکی سۆفتم دەوێ
وەکو دایکم
نەرم نەرم،
لەهاویندا فێنك فێنك ....
لەزستاندا
گەرم گەرم،
ئامێزێکی میهرەبان و
دڵێکی پڕعەشق وشەرم،
ڕاستگۆیانە خۆشی بوێم
لەپێناوی بژیم، بمرم.

## نامۆ

لەو دیوی بێ دەنگیەوە
گوێم لەترپەی دڵی تۆیە
هەزارویەك شعرم بۆت گووت
کەچی هەست هەر نامۆیە

## دۆزەخ

بیرتە دەگووت:
ئەمەن تەنیا ژمارێە
لەگەڵ عەشقی تۆ ڕاهاتووم
ئیتر ئەمەم بژاردەیە
بیرتە دەتگووت:
پیری دڵ تەڕ
لەگەڵ تۆدا من ئاسوودەم
پەیمان دەدەم
هەتا ماوم دەست لەعەشقی تۆ بەرنادەم
کەچی ئێستا
دۆزەخێکت بۆ سازداوم
بەقەد ئیبلیس تیا سووتاوم!
بیرتە دەتگووت:
لەفەرهەنگی عەشقی مندا
بێ ئەمەکی بوونی نییە
درۆت بەدەم عەشقەوە کرد
فەرهەنگی تۆسیخناخی بێ ئەمەکییە!

## شاجوان

جەنگی سێ یەمی جیهانی
لەسەرجوانی تۆ روودەدات
مەگەر ڕووی خۆت جوان داپۆشی
تا ئەم شەڕە بە پانەکات

## دڵسۆزی

دەبمە چەترت
لەزستاندا بۆ باران و
لەهاویندا بۆ سێبەرت
کە باران وگەرما نەما
فڕێم مەدە
لەپایز و لەبەهارت!

## دووڕیان

من لەنێوان تۆ و
نیشتماندا
نازانم کامتان هەڵبژێرم
نە نیشتمان بەتۆ دەدەم
نەتۆش بەنیشتمان دەسپێرم

## ڕوو

گوتیان ئەمشەو مانگ گیراوە
کەچی ئاسمان ڕووناکتربوو
من نەمزانی
ڕووی جوانی خۆت
لەبڕی مانگ پیشان داوە ؟!

٢٠٢١/٥/٢٣

## تابلۆ

کەهاتیە دەر بەنازەوە گوزەربکە
بەسەر سامی زەوی باوەشت پیادەکات
ئاسمان باڵی میهرەبانیت بۆڕادەخات
لەهاویندا هەورسێبەرت بۆ دەکات
لەزستاندا نمەی باران
بەشەرمەوە کوڵمی سورت بۆ تەڕ دەکات
دە دەرکەوە
گوڵ بۆنی تۆ دەپرژێنێ بەسەرخۆیدا
سروشت ڕەنگی لەتۆ دەسوێ
تا ڕووخساری جوانتر بکات

۳۱ی ئاب ۲۰۲۱

## دیاری

گەر بڕیارە
قاسیدەکەت بێتە ئێرە
تەنها یەك تاڵەقژی خۆت
وەکو دیاری بۆم بنێرە!

## خاوەن

هەرچیم هەیە

بۆت دەکەم بە دوولەتەوە

لەتێك بۆ تۆ

لەتێك بۆ خۆم

تەنها دڵم یەك پارچەیە و

نابێ بەدوو

نەك هەردڵم

خۆمیش هی تۆم!

## بەڵین

لەدوا دیداری ماڵئاواییمان

پەیمانت پێدام

یادم بکەی و هەواڵ بپرسی

دووساڵ تێپەڕی

نە زەنگت لێدا

نە نامەت هەنارد

کوا بەڵینەکەت لەخواناترسی ؟

## گریانی عەشق

وەرە بگرین

بەکوڵ بگرین

پێکڕا بگرین

بۆغەریبی و دابڕانی

خۆمان بگرین

هێندە بگرین

تا لەچاوا وشک دەبێت

ئەشک وئەسرین

وەرە بگرین

کە ناتوانین یەخەی بەخت و

چارەنووس و ڕۆژگار بگرین

وەرە بگرین پێکڕا بگرین

هێندە بگرین

تا شێرپەنجەی عەشق دەگرین!

## مەبەست

ئەو ئاوازەی بۆت دەژەنم
ئەو شعرانەی دەیهۆنمەوە
بۆ یەك مەبەست بۆت دەنوسم
تابزانی خۆشم دەوێی
زیاتر لەخۆم خۆشەویستم
دڵنیابە دڵسۆزیە
تا ئەو رۆژەی دەچمە ژێرخاك
نە دەتوانم لەبیرت کەم
نە دەتوانم لەژەنینی هەست و نەستم
نە دەتوانم لەنووسینی
شعرەکانمدا بووەستم!

## عیناد

چەند عینادیم لەگەڵ دەکەی
هێندە دڵم بۆ خۆت دەبەی
با بۆ تۆبێ
ئەو دڵەی من
خۆت خاوەنی راستەقینەی

## دەردە دڵ

کەسینەوە یەخەمی داپێچی

گوتم لەبەرچی ؟

توند دڵی گرتم

گوتی لەمە بپرسە بۆچی

من کە نەتوانم دڵت لێ بەردەم

ئەو دڵە بەردەت

بەردە ئەو دڵەت

با لەدڵ بەردەم

## دووروو

تۆ ناتوانی لەیادم کەی

بۆ کوێ دەڕۆی

لەعینادی و دابڕانت

باش تێدەگەم

دوو ڕوومەبە!

لەم دووریە و بێ دەنگیەت

درۆ دەکەی!

## تابلۆی خەزان

یەك یەك
گەڵاوەریوەکانی ئەم پایزەت
بۆ کۆدەکەمەوە
لەسەر دانە دانەیان دەنووسم
پەشیمانم
دواتر بەلقەکانیان دەلکێنمەوە
لەسەر تابلۆی ئەم خەزانە
بۆت دەنوسم:
چەند عینادی
هەزار هێندە خۆشمدەوێی
گەر نەشهێیتەوە .

## بڕۆ

تازە بە ڕیشی سپی و
پشتی چەماوە
چیم داوە لەم عەشق و
بەزمی ئەو یارە ؟
ئەوەی لەتۆ دەستکەوتم بوو
هەر پیرییە هەر ئازارە
بڕۆ ئیتر خوات لەگەڵ بێ
جارێکی تر نەیێیتەوە
ئەم هەوارە!

## بۆن

بۆنت لەگەڵ بۆنی باران
تێکەڵ بووە
هەر دڵۆپێك لەم بارانە
لەگەڵ ڕۆحم
ئاشنابووە
بۆنی یەکەم بارانی پایز
وەك بۆنی یەکەم دیدارتە ئازیز!

# دەرۆزە

خۆم کرد بەسواڵکەری گەڕەك
ماڵ بەماڵ و
کۆڵان کۆڵان
بەدوات گەڕام
دەرگا
دەرگا
لەزەنگم دا
دەستم بردوو چاوم گێڕا
هێندە هاتم
هێندە گەڕام
هەر بەڕاستی بوومە سواڵکەر
لەپیشەکەی خۆم وەرگەڕام!

## سۆڤا

تۆ بەس وەرە
لەئامێزی میهرەبانی
عەشقی مندا کەمێك بنوو
رۆحم دەکەم بە سەرینت
دڵم دەکەم بە پێخەفت
چاوم دەکەم بە پەرژینت
وەك پاسەوانێکی دڵسۆز
تا بەیانی لەچوار دەورت ئێشك دەگرم
لێ ناگەڕێم بەئاگابێی
بەئەسپایی ترپەکانی دڵت دەژمێرم
بەبێ دەنگی لەناخی خۆم
هەزار جار لەبەرت دەمرم .

## کۆڤید ١٩

ماسکەکەت
وەك دیاری با لای من بێ
چونکە بۆنی
هەناسە و رۆحتی لێ دێ

٢٠٢٠/١١/٢

## قیامەت

گوتم خوایە
ئەمڕۆ شەونێ
گوتی نابێ
ڕۆژ بێ شەوبێ
گوتم هەردێ
گوتی هەردێ
گوتم مادام
پێش ئەوەی بێ
قیامەت بێ
چونکە ئەمشەو
مارە وشوودێ
قیامەتی دابڕانی
دوو عاشق دێ

٢٠٢/١٠/٢٥

## سەعات

من و تۆ
وەك چرکە و خولەکی کاتژمێرین
هەر بەدوای یەکەوەین
بە یەك ناگەین
هەر دەژمێرین لەیەك ناگەین
دەخولێینەوە ماندوونابین
هەرتێك ناگەین
هەرپێك ناگەین

## لاو

کەی دێیتەوە
تەمەنێکە چاوەڕوانی
هاتنەوەی تۆم
سەر و ڕیشم
لە دووری تۆ خر سپی کرد
درۆ لەگەڵ خۆم دا دەکەم
ئاخر گەنجی کەی دێیتەوە

هەولێر
٢٠١٨/١٠/٢٧

## ڕێز

حزب و هەندێ ژن
لەبێ وەفاییدا
زۆر لێك دەچن
هەردووکیان
ڕێزی پیاوی
دڵسۆز ناگرن

## سەوز

تۆ بەهاری
هەر لەپایز دەردەکەوی
بۆیە گەڵای دارەکانت
بەهیچ بایەك هەڵناوەری
هەر چوار وەرزت
هەر بەهارە
شەوی تارت هەر رۆژگارە
کێ دەزانی
ئەمە دیاری
پەروەردگارە!

## ئاوێنە

لە دوورەوە لێت دەڕوانم
دڵنیابە
لە ناسینت پەشیمانم
تۆش بڕوانە
ئەو پەنجەرەی
تیشکی خۆری
بەردەکەوێ
نەك ئاوێنەی لێڵا و تاریك
تا ڕووخساری
ڕاستەقینەی خۆت دەرکەوێ
ئەوەندە بەدوای ناو دامەگەڕێ
دواتر ناو خنت زوو لێ وون دەبێ
بەدوای شکستی خەلك وێڵا مەبە
سەرکەوتنی خۆت
مەخەرە ژێر پێ

هەولێر
٢٠١٩/١٠/٢

## یادگاری

چەندین ساڵە

ئەو شتەی لەتۆ بۆم ماوەتەوە

شوشە بۆنێکی بەتاڵە

هێندم بۆن کردووە

بۆنی ئەوم گرتووە

هەموو بەیانیەك

هەموو ئێوارەیەك

دەست دەهێنم بە شوشەکە

ئەو شوشە بەتاڵە

لە هەموو بۆنە پڕەکانی

دونیا بۆنی خۆشترە

بە بەها ترە

ئەو شوشە بەتاڵە

ئاوێنەیە

هەموو ڕۆژێ وێنەی تۆی تیا دەبینم

بۆنی تۆی لێ دەکەم

٢٠١٩/١٠/٢٩

## بڕیار

وەك دەسەڵات دوو ڕوو مەبە
بە ڕۆژ بزەم بۆ دەکەیت و
وەك هەرزەکار چاو دادەخەیت
شەویش کۆڕی ناحەزانم
وەك سۆزانی گەرم دەکەیت
لە دووڕیانی چاوەڕوانی
ئومێدم کەی دەدەیتەوە
ئۆقرەم نەما ئەم بەزمە کەی دەبڕێتەوە
یاخود بڕۆ ئەم هەوارە بەجێ بێڵە و سەر هەڵگرە
یانیش وەرە
لە ئامێزی میهرەبانیم دڵ هەڵگرە

۲۰۲۰\۷\۲۷

## پەیمان

بیست و پێنج ساڵە نەمدیووی
من لەو دیوە و
تۆ لەو دیوی
کەچی ئێستا لێم دەپرسی و
دەڵێ بۆچی لەمن دووری
بیرتە دواجار چیت پێ ووتم
بڕۆ ئیتر لەمن وونبە
وا دابنێ نەمناسیوی
هەر نەمدیووی

## هۆگری

هەموو شەوێ دێیە خەونم
وەك پەپوولە دێی دەنیشی
لەسەر پەڕەی سینە و دڵم
نازانم بۆ هۆگرم بووی
من نە بەهارم، نە گوڵم
تۆ ناسك و نەرم و جوان
من ڕەق و پیر تا سەر ئێسقان

## نامەی کچێکی فریودراو

چیتر نامەم بۆ نەنێری
درۆکانت مەشارەوە
لەنێو گوڵی سوری بۆندار
وەکو دیاری
ئاشکرا بووی بەم کارانە ئەتوو فێری
چ ڕۆڵێکی پاڵەوانی عاشقی درۆت بۆم دەگێڕی
پەشیمانم لەو نامانەی بۆم دەنووسی
لەو فرمێسکە ڕاستگۆیانەی بۆم دەڕشتی
نمایشی دوو ڕوویی تۆ کۆتایی هات
بسڕەوە گشت شیعرەکانم دێر بەدێری
نەفرەت دەکەم لەو کەسانەی
ماسکی ڕووخسار بەرهەم دێنن
تا تەمەنی هەزار گەنجی ڕستگۆی وەك من
بۆ لەتێ نان بفەوتێنن
چەند بەڵێنت بە عەشق دا و وەفات نەکرد
دڵت ڕێگەی پێچەوانەی پەیمانەکەی ئەوینی گرت
خەجاڵەتی ئەو کاتانەم لەگەڵ تۆدا بەسەرم برد
هەرچیم هەبوو لە گۆڕمنا
لەگەڵ عەشقی درۆی تۆ مرد

## کۆچ

لەدووری تۆ
پیری تەواو یەخەی گرتووم
ئەگەر هاتی
دیاری دەستت گۆچانێك بێت
تازە لەگەڵ دووری تۆدا من ڕاهاتووم

## میرات

ئەوەی لە تۆ و
لە عەشقی تۆ بۆم جێماوە
چەند نامەیەکی ڕوو زەرد و
تاڵە موویەك و
شووشە بۆنێکی بەتاڵ و
پێنوسێکی نووك شکاوە

## چاوەڕوانی

تۆ هەر نایێی لە بڕی خۆت
چاویلکەیەك و
گۆچانێکم بۆ بنێرە
لە چاوەڕوانی هاتنەوەت
هەم پشت چەما
هەم چاو کوێرە

## گەڵا

شێوەکار
بت و پەیکەر
لە ئاسن و لە بەردی رەق
بەرهەم دێنێ
ئەو دڵەی تۆ چ جۆرێکە
نە وورد دەبێت
نە وەك ئاسن ژەنگ هەڵدێنێ

٢٠٢٠/٨/١١

## مردن

ئەگەر مردم زوو بمنێژن
نەکا بێتن
ئەشکی درۆ
لەسەر تەرمم بڕێژێتن

٢٠٢٠/٨/١١

## متمانە

ئیتر سپاردەی ئەوین و عەشق
ناگرمە ئەستۆ
بۆ درەنگ هاتی ؟
متمانەم نەما
نە بەخۆم و نە تۆ!

## بێ ڕەحمی

چەند بێ ڕەحمیت
دەڵێ ڕحمت دەرهێناوە
تۆ ناترسیت
شوو بکەیت و نەزۆك دەرچیت ؟

## چاوەڕوانی

کەی دێیتەوە

لەدووری تۆ سەرو ڕیشم گشت سپی کرد

زۆر دڵ ڕەق و بێ بەزەییت

لەخەونیشا سەردانێکی مەعشوقی خۆت جارێك نەکرد

## وەکو مانگ

ببە دوو ڕوو

ڕووێکت بۆ کۆشش و

ڕووکەی ترت بۆ پشوو

## چاوەڕوانی

ئیتر ئەو پەنجەرەیەش

لەچاوەڕوانی تۆدا ئارامی لێبڕاوە

مرد بەو داخە

دوانزە ساڵە دانەخراوە

دوایین نیگای لەبەرچاوە

پەیامێکی ڕاستگۆیانەی بۆ بنێرە

یا وەرەوە یا ئەو دڵەی پێ داخە!

## نهێنی عەشق

دوای مردنم
تەنها وەرە بۆ سەرگۆڕم
هەندێ نهێنیت پێ دەڵێم
کە نەمتوانی بەزیندوویتی
بۆت دەربڕم
گەر حەزت کرد لەناوگۆڕم دەرمبێنە
خۆڵەمێشی ئێسك و پروسکم
بکە گۆزە و
ژەهری عەشقی تیا هەڵگرە
یا بمکە کل
باش بمهاڕە
بە بام بدە لەم هەوارە
یا بمکە پەند
کە ناوم هات نەفرەتم کەن
کوڕ وکچانی ئەم شارە!

٢٠٢٠/٨/١٣

## تەڵاق!

درەنگ هاتی
تا خەرمانی خۆشەویستیت نەسووتاندم
تۆ نەهاتی ....
ئەکتەرێکی دوو ڕووبووی تۆ
ڕۆڵی عەشقت جوان دەگێڕی
منی سادە باوەڕم کرد
بێ ئاگابووم
بە نەزانی متمانەم کرد
دواتر لەناکاو جێت هێشتم
هاوارم کرد ....
فریام کەوە!
دوا پەیامە لێم وەرگرە
هەر نەهاتی
دواتر زانیم دەنگم ناگات
تۆ بەردەوام لەگەڵ فرێند
لەسەر چاتی!

## شێتی

دەریشمکەی لێرە ناڕۆم
دێمە بەر دەرگای عەشق و
سوالّی ئەوینت لێ دەکەم
دڵنیابە
من هۆگری جوانیت نەبووم
شەیدای زێڕ و
بڕوانامە و
پارەت نەبووم
ئەوەی منی ئالّوودەکرد
تەنها عەشقە
کەچی هێشتا
هەر تێناگەم
هەر چەند دەکەم
هەر پێت ناگەم!

## ئالوودە

ئەم شیعرانە
بەڵگەی پاکی عەشقی منن
گەرچی لەئاست جوانی تۆدا
زۆر شەرمنن
منت بوێ
منت نەوێ
بەلامەوەگرنگ نییە
وا تێکەڵی عەشقت بوومە
بوون و نەبوونت
هیچ جیاوازی بۆ من نییە!

## ژن

لەوەتەی حەوا بۆتە ژن
پیاو لەسەر ژن
یەکتر دەکوژن!
هەر ژن دەکوژن!

١٢,٩,٢٠٢٠

## عەشق و پیری

دوای ئەم هەموو دابڕانە
چیت داوە لەم عەشق و ژانە
تەمەن تامی تیانەماوە
بۆ خۆت خستە نێو ئەم داوە؟
جارێك شكستت هێناوە
قوربانیت دا لەم پێناوە
قەرزی ئەوین نادرێتەوە
قەد قەرەبوو ناكرێتەوە
پیری و عەشق كرێتیە
یاخود مەرگە یا شێتیە!

## من تۆم

دەمەوێ ڕۆژێك لەبیرت كەم
ئەورۆژە زیاتر بیرت دەكەم
دەمەوێ ڕۆژێ بێ تۆبم
ئەو ڕۆژە وەكو ئەوە وایە من تۆبم!

## خەون و خەیاڵ

بەدوای چ عەشقێکدا وێڵی

لەم سەردەمە مەعشوق عاشقی جێ دێڵی

نە پێ دەگەی

نە لێی دەگەی

گەر بەتەمای ژوانیشی

یا دیداری شەوانیشی

یار خەوتووە

بێ ئاگایە

هەرگیز ناچیتە خەونیشی!

٢٠٢/٨/٢٣

## بە بەرچاوتا دەتوێمەوە

لەدووریتا

تەمەن وەك وەك گەڵاكانی پایز

هەڵدەوەرێت

تۆ هەر نایەیت

دەسووتێم و ژیان لای تۆش

وەكو بەهەشت دەگوزەرێت.

## گەمانۆکە

بیرتە گیانە
بە منالّی لە کۆڵانی نێو گەڕەکەدا
یاری ساپ ساپانێت دەکرد؟
منی لاسارساپەکەتم دەڕفاند و
تۆی نەرمۆکە
بە قیژەوە بەدوای مندا ڕاتدەکرد
یاریەکانت لەبیرماوە ؟
چاوشارکێ و بووکۆکە ...
مێروو و مێرووانێ و فڕفڕۆکە....
ئێستاش مێرووە شین و زەرد و سوورەکانت
لەنێو قوتووە پلاستیکە شکاوەکە هەڵگرتووە
دانە دانە بۆنی سادەیی
منالّی تۆیان گرتووە
خۆ من ئەوسا عاشق نەبووم
نەمدەزانی هۆگربوونی کچۆلەیەك
چ بەزمێکی بەمن دەکرد!

## بیرتە گوڵە

لەنێو هەموو کوڕەکانی گەڕەك
دەستت بۆمن درێژ دەکرد
بەقەستۆکە خێزانێکمان دروست دەکرد...
تۆ دەبیووتە شاژنۆکە
منیش دەبوومە مێردۆکە!
بیرت نایە
ناوم لێ نابووی قشتۆکە ؟
لەهاتووچۆی ڕێی مەکتەبیش
جانتاکەم بۆهەڵدەگرتی ؟
نووکی پێنووسە دارەکەت
دەشکاو و
بەدەم لەبۆم چاك دەکردی ؟!
لەحانوتیش درەنگ دەهاتی
هەردەم ڕیزم بۆ دەگرتی
حەزت دەکرد لەبۆت بکڕم
کیك و لوقم و شەکرۆکە ....

## لەبری تۆ

تێنووسەکەت لە لای من بوو
وانەکانم بۆت دەنووسی
ئەرکی ماڵم بۆ دەکردی
چەند ناخۆش بوو!
ئەو ڕۆژەی مامۆستا گوتی
ئیتر نابێت کوڕ و کچ
لەسەریەك ڕەحلە دانیشی

## سپاردە

ئەمڕۆ دڵمت بۆ دەنێرم
ئەمانەتە
بەخاوەنی ڕاستەقینەی
خۆی دەسپێرم

## من و پایز

من و پایز زۆرلێك دەچین
کە ڕەشەبای خەم هەڵدەکات
وەك گەڵاکان هەڵدەوەرین
لەناو دەچین!

٢٠٢٠/٩/٣

## دیاری

چیتر بەرگەی چاوەڕوانی تۆ ناگرم
لەم جەژنەدا چی شك نابەم
بۆت بنێرم
تەنها دڵم وەکو دیاری
پێت دەسپێرم
دڵێك ئاگای لەمن نەبێت
بۆ لەسینەم هەڵیگرم ؟

## چیرۆکی عەشق

کە تۆم ناسی هەرزەکاربووم
تازە چەند تاڵەمووێکم
لە ڕووخساردا دەرکەوتبوو
کە ڕۆیشتی و بەجێتهێشتم
سەر و ڕیشم وەك شەوی تار، هەمووی ڕەش بوو
دوای سی ساڵی چاوەڕوانی
ئێستا نامناسیتەوە، هەرچی مووە گشت سپی بوو
پشتم چەما، چاوم کزبوو!

٣١ی ئاب ٢٠٢٠

## تکای عاشقێك

له خاچم دەن
بەستوونی شەقامەکانی
ناوشارا هەڵمواسن
بمدەنە دەست جەلادەکانی دەسەڵات
چیتان دەوێت لەجەستەمدا
دەریبێنن
لەت لەتمکەن بمسووتێنن
بەڵام توخوا
بۆیەك چرکەش
دڵی ئەوین مەڕەنجێنن
مەعشوقم لێ مەتۆرێنن!

٢٠٢٠/٩/٩

## ئامێز

بیرت ماوە کە منالّ بووی

بەدوای دایکت دەگریای و

ڕات دەکرد ؟

تا پێی بگەی

لچکێکی کراسەکەی بەدەست بگری

ئەوسا ژێر دەبوویتەوە

لەبیرتە بەیانیان

لەخەو هەڵدەستای و باوکت ڕۆیشتبوو

ڕۆژانەکەی لەبیرچوو بوو؟

تۆی گرینۆك هانات بۆ دایکت دەبرد

ئەویش دەستی بەسەرتدا دەهێنا و

فرمێسکی چاوەکانی دەسڕی ؟!

زیادەیەکی دەخستە سەر ڕۆژانەکەت

بۆی دەخستیە نێوگیرفانت

لەیادت ماوە

لەزستاندا لەگرمەی هەوردا

ترسای

شوێنێك نەبوو پەنات بدا

تەنها باوەشی دایکت نەبێ ؟
برسیت دەبوو
توێنووت دەبوو
خەوت دەهات
هەر ئامێزی گەرمی دایکت شك دەبرد
لەسەر سینەی نەرمی
ئەو نەبا ئاسوودە نەدەبوویت
ئێستا خۆ دایکت نەماوە!؟
پێم نالێی هانا بۆکێ دەبەیت
لەمن زیاتر کەسێك نییە
ئامێزی لەدایکت گەرمتر بێت
ئەگە رنەشهێت
من دەبمە ئەو منالەی
بەبێ سۆزی دایك
گەورە دەبێت
لەباوەشی هیچ ژنێکا
ئارام نابێت!

## پەنجەرە

ئێستاش بۆنی عەشق
لەو پەنجەرەیە دێ
جاران بۆ نیگایەکی نهێنی
لەدوورەوە دەکەوتمە ڕێ
ئێستا، کە هەی
رۆح و جەستەم لێت دەڕوانێ!

## فیمینیست

جاران کە ژن جلی دەشوشت
لەشەرمانا
لەژێر جلی پیاوەکەیدا هەڵی دەخست
بەڵام ئێستا
مایە و سوخمە
لەسەر دەرگا هەڵدەواسێ
بە بەرچاوی کوڕ و کچ و
ناحەز و دۆست!

٢٢,٩,٢٠٢٠

## ئێستا

کاتێ دەمرم!
نەکەی بێی و
ڕووت دارنی
کۆڕی شینم بۆ مەگێڕە
یەخە و سنگت بۆم دامەدڕە
من تا زیندووم ڕێزم بگرە
وەرە گۆڕێك بۆ ناکۆکیەکانی
نێوانمان هەڵدرە!

## دوو ڕوو

هەی دوو ڕوو
جارێ نەهاتی
دانیشین ڕووبەڕوو
چەند لاملی
ڕق ئەستووری
وەکو ڕەگی دابەڕوو!

## خەون

هەموو شەوێ دێیە خەونم
پەنجەرەیەك
وەك باوەشی
میهرەبانی دایكمم لێ دەكەیتەوە
هەرچی ڕق و تووڕەبوونی
ئەو ڕۆژەیە
وەكو باران دەیشۆیتەوە .
خۆزگە
خۆزیا بیرت
لەگەڵ پرچت گەشەی دەكرد
خۆزگە هەستت
بەقەد قژت
نەرم و جوان و ناسك دەبوو
هەموو ڕۆژێك
شیعرێكت بۆ دەهۆنمەوە
بەو خەیاڵەی ڕۆژێك دابێت
پرچ و هەستت بهۆنمەوە .

## میراتی علی عاشق

گەر دەمزانی وازوو دەمرد
دەچوومە لای
مۆڵەتم لێ وەردەگرت
خەڵوەتی عاشقانەی ئەوم
بەمیرات بۆخۆم دەبردا

## دیاری

چیتر بەرگەی چاوەڕوانی
تۆ ناگرم
لەم جەژنەدا چی شك نابەم
بۆت بنێرم
تەنها دڵم وەکو دیاری
پێت دەسپێرم
دڵێك ئاگای لەمن نەبێت
بۆ لەسینەم هەڵیگرم ؟!

## تاڵەقژی زێڕین

یەك داوەپرچی تۆ
بۆمن بەسە،
ئەی تۆ ؟
ڕۆژانە لەگەڵ شانە
دەیان تاڵەقژی جوانت هەڵدەوەری
داوای یەك داوم لێکردی
گووتت حەزناکەم
یەك داوەپرچم بێتە دەرێ!
وەك لەتیف هەڵمەت
پرچت ناکەم بەڕەشماڵی
گەرمیان و کوێستانەکەم
تەنها یەك داوم لێت دەوێ
دەڵێی داوی قژی منت لەبۆچی یە ؟!
دەڵێم دەیهۆنمەوە
لەگەڵ چەندان تاڵی تری ئەو عاشقانەی دەیانناسم
دەیکەم بەپەتی سێدارە
دوای دابڕان لەنێو باغی شارا
خۆمی پێ هەڵدەواسم!

## ڕوو

من وەك دراو
هەردوو دیووم
هەریەك ڕووە
چاوی تۆیە
تێڕوانینی ڕاستەقینەی
تێپەڕبووە
من هەر خۆمم
هەروەك خۆمم
هۆگرت بووم
واخەریکە لەبوونی تۆ
خۆم وون دەکەم
واهەست دەکەم
من هەر نەبووم
گەر تۆ نەبیت
یا لەیتەنی
هەرخۆڵ دەبووم

## هەست

ئەو نامیلکە شیعریانەی
بۆت هەناردم
پیت بەپیتی
وشە وشەی
دێر بەدێریم خوێندۆتەوە
هەستم دەکرد
هەر پیتێکی دەجار بۆنی تۆی گرتووە
ناونیشان و
وێنەی بەرگ و
ژمارەی سپاردنیشم
وەکو ناوی خۆم ئەزبەر کردووە
بەم زووانە
هەر هەموویان دەهێنمەوە
لە نامیلکەی عەشق و پیری
لە لاپەڕەی (سی و هەفتیدا)
چەند دێرێکم بۆت نووسیوە
لێم ببوورە بێ پرسی تۆ
هەستی خۆمم دەربڕیوە .

٢٠٢٠/١٠/٨

## وەفا

کە نەتوانم
لەباوەشی بەخشندەیی
عەشقی خۆمدا هەڵتگرم
دەبمە پردی پەڕینەوەی
ئاسوودەبیت لەژیاندا
هەتا دەمرم!

## ئومێد

پەلەم نیە
چاوەڕێتم
تا داو داوی سەر و ڕیشم سپی دەبێت
دڵنیامە ڕۆژێ دادێت
زەنگی دەرگای چاوەڕوانیم
هەر لێ دەدرێت .

## مۆركی تاوان

ئەمشەو باسی بەسەرهاتی جیابوونەوەت دەدركێنم
تا لەمێژووی ئەوینداری
بە ناپاكی بتناسێنم
مۆركی تاوان وەك خاڵی ڕەش
بەنێو چاوانتەوە دیارە
بۆ هەر شوێنێ سەرهەڵگری
هەر دێیتەوە ئەم هەوارە
ئێستا لەوێ
زەماوەندی بووكێیان بۆ سازداوی
ئەڵقەی پەنجە و
جلی مۆدە و
زۆر دڵخۆش و لەخۆبایی
منیش لێرە
چاوەڕوانی هەواڵی زیزبوونت دەكەم
تا بێیتەوە بۆ باوەشی
یەكەم ژووانی ئەوینەكەم
هەر دێیتەوە
دڵنیامە هەردێیتەوە

ئەمڕۆ یاخود ساڵێکی تر
بەئاشکرا یا نهێنی
ڕێچکەی عەشق دەگریتەوە
بەڵام ئەفسوس پەشیمانی دادت نادات
کە دێیتەوە
نە من نە عەشق نادۆزیتەوە

## هەر لەوێم

ئەگەر نەشهێیی
من هەر لەوێم
چاوەڕوانی هاتنی تۆم
نا نا
نەکەی بە تەنهابێیی
من دڕەندەم، ڕەنگە بتخۆم
کچێ شێتە
من هۆگری وێنەکەت بووم
لەشیعریشا
عاشقت بووم
هەر پابەندی ڕێبازی تۆم
لەسەر ڕێچکەی ئەوین دەڕۆم

## ئاوێتەبوون

لێمگەڕێ با لەگەڵ عەشقت ئاوێتەبم
تۆ بەناز و
لەنجە و درۆ
من بەخەم و ئازارەوە
لێمگەڕێ با لەگەڵتبم

## دڵ بەرد

بەردیش
گوڵی لێ دێتەدەر
ئەو دڵەی تۆ
چەندە ڕەقە!
کانگای ڕقە
کارگەی ژەهرە
یا خەڵوزی شەمەندەفەر؟

## چاوەڕوانی

گووتت دێم و هەرنەهاتی
زستان هات و
باران باری وهەرنەهاتی
بەهار و گوڵ پێکڕاهاتن
تۆ نەهاتی
گەرما ڕۆیی و هەرنەهاتی
خورماش گەیی و تۆ نەگەیی
پایزیش هات تۆ نەهاتی
هەموو هاتن تۆ نەهاتی
لەخەونیشا هەر نەهاتی
تۆ ووشکە ساڵی و نەهاتی
هەر نەهاتی
بۆ نەهاتی ؟

## ماڵی دڵ

نامەوێت ماڵێکت لەسەر لمدا
بۆ دروست کەم
بەیەك ڕەشەبای بیابان
لەناو بچێت!
کۆشکێکت لەناو دڵدا
بۆ بنیات دەنێم
بەهیچ هێزێکی دەرەکی
نەڕووخێت .

## لەخۆبایی

من عاشقی مامۆستایەکم
زۆر ڕقم لە وانەکەیەتی
خۆی وەك بەهار
نمایش دەکات
کەچی کۆتایی پایزیەتی!

## مردن

ئەمڕۆ بینیم
دوایین گەڵا
لەم شارەدا چۆن هەڵوەری!
بڵێن پایز
ڕەزات قورسە
ئیتر بێرە
تێنەپەڕی .

## کۆچ

ئەو شارە بێ تۆ دۆزەخە!
ڕق وگڕی لێ دەبارێ ...
کوچە و کۆڵان و شەقامی
هیچ گوزەری پێدا ناکرێ
وێرانەیە وێرانەیە
ئەم شارەی من
وەکو دڵم وێرانەیە
خەم و شەمی لێ نابڕێ
دەڵێی وەلی دێوانەیە!

## زەنگ

هەر زەنگێکی مۆبایلەکەم
کە لێ دەدات
وا دەزانم تۆی و
دڵم لێ دەدات!
هەر پۆستێکی فەیس بووك و
تویتەر دەکەم
چاوەڕوانی لایك و کۆمێنتی تۆ دەکەم
ڕۆژانە سەدجار
لێرە و لەوێ
سەیری میسنجەر و
ڤایبەر و ئیمۆ و وەتسئاپ و تیلیگرام دەکەم
دەڵێم دەبێت دڵی بێت
نامەیەکم بۆبنێرێت ؟!

## عەشق

کێ دەڵی تۆ فریشتەنیت!
پەیامی عەشق و
موژدەی بەهەشتت نەهێناوە؟
کێ دەڵێ تۆ ئیبلیس نیت و
دۆزەخێکت لەناخدا سازنەداوە!؟
هەرکامیان بیت
هۆگرت بووم
لە فیردەوس و دۆزەختدا
ئارام دەنووم!

## مۆمی تەمەن

بەڕۆحی من
مۆمی تەمەنت داگیرسانت
کە ڕۆشن بوو ڕێی ڕۆیشتننت
لەتاریکی بەجێتهێشتم
ئێستاش دەچێژم ئازاری دابڕانت
تۆ لەکوێی من دێمە ئەوێ
عەشقی جارانم خۆشدەوێ.

## ژووان

ئەمشەو نانووم
ئێشکگری ڕاز و هەستم
ئەگەر نەشهێی چاوەڕێتم
دڵم وەك دیاری داناوە
لەناو دەستم
تۆ هەر نایەی
بە ناچاری ژووان لەگەڵ شیعر و
نامە و وێنەکانت دەبەستم .

## ئینقلاب

کودەتات بەسەر منداکرد!
لەکۆشکی پاشایەتی عەشقدا
منت دەرکرد
سوپای خەم و ئازارت ناردە سەرم و لەناوم برد!
مافی خۆتەگوێم لێت نەگرت
سکاڵا و داواکاریەکانتم بەهەند وەرنەگرت
سەرەنجام
خۆم و شکۆی عەشقم لەباربرد!

## پیری عەشق

چێژ لەخەم و ئازاری
دووری و دابڕانت دەبینم
لێم گەڕێ با چیرۆکی چاوەڕوانی
بکەمە داستانی عەشق و ئەوینم
لێم گەڕێ با لەنێو دەریایی چێژی ئازارات
هەر بەخنکاوی بمێنم
یا وەرەوە لەم دۆزەخە دەرم بێنە
تا تابلۆی ئاشتبوونەوە
لەسەر دیواری ئەو شەقامە بنەخشێنم
کە دواجار لەوێ پێتگووتم
بڕۆ ئیتر نامەوێ بتبینم!

## متمانە

وەك گەڵاکانی پایز
دانە دانە عومرم وەری
تۆ ڕۆیشتی و متمانەشت لەدەست داوە
ئیتر بەسە
خەم و دەردەسەری.

## عەشق و ژن

لەم سەردەمە

کەس لەعەشقی پیاوێکی پیر تێناگا

گەر دوو ڕستە لە دێرێکا

وەکو شیعر بۆ خۆی ڕیزکا

دەڵێن شێتە، یا خەڵفاوە

ئەم پیاوە بۆ وادەکا؟

من عاشقی ئەو ژنانەم

بەرگەی عەشقی

پیاوی پیری دڵ ڕەق دەگرن

لەبەرامبەرستەمی پیاو

بێ دەنگ دەبن

پاداشت لەخودا وەردەگرن

ژنێك سی ساڵ

لەگەڵ پیاوێك وەك ژن ژیا

هەموو ڕۆژێ بەنهێنی بۆ خۆی .گریا

کەس نەیزانی لەنهێنی ئەم گریەیە

کە پیاوەکەی وەفاتی کرد

نێرەمووکانەیە!

من عاشقی ئەو ژنەمە
بیست و حەوت ساڵ
بەدیار پیاوێك دانیشتووە
نەیهێشتووە کەس بزانێ
مێردەکەی ئەو لەپیاوەتی
نێرکەوتووە!
من عاشقی ئەو ژنەمە قوربانی دەستی باوکێکی
دابوونەرێت بۆگەنە
بەکچێنی نامەی کوڕێکی لێگیرا
گەر مامۆستای مزگەوت نەبا
بەردباران وریسوا دەکرا!
هەر ئەو ڕۆژە سزا سەپا
لەپیاوێکی پیری نەزۆك مارەکرا
من عاشقی ئەو دایکەمە
منداڵێکی فڕێدراوی هەڵگرتەوە
لە ئامێزی میهرەبانی گەورەی کرد و
کەس نەیزانی کەبیژییە
لە پاداشتی ئەم کردەوە
ئێستا لەخانەی پیری کەوتووە!

من عاشقی ئەو ژنەمە

سەربەهەوێ بەزۆر دەیدەن بە ئامۆزا

هەر بۆ جووت بوون

هەر بۆ منالٚ

هەموو دەڵێن ئەرێ نەزا!

من عاشقی ئەو ژنەمە

لەبەر بوختانی پیاوێکی دەم شڕ

خۆی سووتاند!

من عاشقی ئەو ژنەم

سی و دوو ساڵە

لەئامێزی پیاوێك دەنوێ

خۆشی ناوێ!

ئەم دۆزەخە قبوڵ دەکات

هەر بۆ ئەوەی مناڵەکان

لەدەست نەدات

من عاشقی ئەو ژنانەم

ژن بەژنیان پێکراوە

تا نەچوونە سەرجێی زاوا

نەیانزانی چ وەحشێکە ئەو پیاوە

من عاشقی ژنێکم
پیاوی سەرشێت ڕێی لێ دەگرێت
لەترسی ئابڕووی خۆی
ژمارەی مۆبایلەکەی لێ وەردەگرێت
من عاشقی ئەو ژنە بێ تاوانەم
پیاوێکی تڕوهات
تەڵاقی دەدات!
بۆ گەڕانەوەی ناچار مارەبەجاش دەکات!
من عاشقی ئەو ژنە بوێرەم
شەڕدەکات تاشکۆی نەشکێت
من عاشقی ئەو ژنەمە
خوشکی چوار برای چرووکە
لەمیرات بێ بەش دەکرێت!
من عاشقی ئەو ژنەمە
لەسەر زەنگی مۆبایلێك
بەبێ تاوان ریسوا دەکرێت
پیاوەکەشی هەموو شەوێ
لەگەڵ ژنێ ژووان دەگرێت!

من عاشقی ئەو ژنەمە
لەپێناوی عەشقی پیاوێك
هەرچی هەبوو لەدەستی دا
تاپێی بگات
کەپێی گەیشت
تێی نەگەیشت
هەتا ئێستاش لێی نەگەیشت
من عاشقی ئەو ژنەمە
دایکە دایك
نموونەیە لەجوانیدا
لە ڕەوشت و
هەڵسوکەوت و
میهرەبانی و
دڵسۆزیدا...
تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنی
هەموو دونیا
ناتوانێت کۆپی بکا

## ژنێک ژیانی گۆڕیم

من عاشقی ئەو ژنەمە
گەنجی و پیربی هەمووی خەمە
بەکچێنی دوای دوو هەوڵی
شکست-خواردووی خۆشەویستی
بەقەیرەیی بەناچاری
پیرەمێردێکی هاودەمە!
من عاشقی ئەو ژنەمە
ژیان لای ئەو بۆتە گەمە
سی و حەوت ساڵی تریش بژی
لەجوانیدا تەژی تەژی ....
بەیەك نیگای ژێر چاویلکە
ڕۆژێ سەد من دەکوژی!

## درۆ

تۆ ناتوانی لەیادم کەی
بۆ کوێ دەڕۆی؟ بۆ کۆچ دەکەی ؟
لەعینادی و دابڕانت باش تێدەگەم
دووڕوو مەبە
لەم دووریە و بێ دەنگییەت درۆدەکەی .

## شکۆ

من بەدوو چاوی کزەوە
خودام بینی
بەدیهێنەری بینایی چۆن نامبینێ ؟
من کە هاتم بۆ بینینی دوو چاوی تۆ
تۆ بەچاوی پڕ جوانیتا بۆ نامبینی ؟
بۆ کوێ دەڕۆیت
ئەو مردنەی لێی ڕادەکەیت
لەو شوێنەیە کە بۆی دەڕۆیت
کێ دەتوانێ لەئاو بێت و
ئاوی نەوێت ؟
بەشکۆوە مەرگ بدە
تۆ هەر دەمریت!

## لامل

ڕامەکە لێم
تۆ ناتوانیت لادەی لەڕێم
وەکو سێبەر
هەر بەدوات دێم
هەر دێم
هەر دێم
تا خۆت دەڵێی
نزیك بە لێم

## جیاوازی

پیاوێك گریا
هەموو دونیا هاتە فریا
هاتە گرین
ژنێك گریا
ژنێك سووتا
ژنێك فەوتا
هەمووگوتیان نمایشە
پێی پێکەنین!

## پیاوێك گریا!

گوتیان سەیرە
چۆن پیاو دەگری ؟
گوتم بۆ نا
پیاو ڕۆژانە دڵی دەیان ژن دەشكێنێت
بە بوختانێ گڕ لەجەستەی
سەد پەپوولەی تازە فڕیو بەردەداتن
هەزار خونچە و گوڵی عەشق دەقرتێنێ
دەبا جارێ گریە و ئەشكی
چاوی خۆی ببینێتن!

## گریان

ئەی ژنەكان
گریان مەكەن بەهی خۆتان
ئێمەی پیاویش جارجار دەگرین
لەپێناوی ئێوە دەگرین!

## سێداره

من هۆگری ژنێکم
نه دیومه
نه دەیناسم
لەخەونی داهاتوشدا
نه خەزاڵه، نه لاسم
لەدێری شعرێکمدا
پێی دەڵێم با بتناسم
بسکی دەکەم
به پەتی سێدارەی دەنگ و باسم
له لاپەڕەی کتێبێك
خۆمی پێ هەڵدەواسم!

## تەنهایی

ئەبێ تۆ بە بێ من چۆن بیت ؟
گوێ لە ترپەی دڵی تەنهایی
خۆت چۆن بگریت ؟
کام گۆرانی بۆ غەریبی و
دابڕان و دووریت بچڕیت ؟
شەوان کەی و چۆن دەخەویت ؟
کەی بەیانی دەکەیتەوە
هەنگاوەکان چۆن هەڵدەگریت!
لە شەقام و کۆڵانەکان
چۆن دەڕوانیت ؟
شارێ بۆنی عەشقی منی تێدانەبێ
چۆن چۆن ژیانی لێ دەکەیت ؟
ڕۆژێ چەندجار
پەشیمانی دادەگریت و
لەداخانا چەندجار دەمریت ؟!

## مامۆستا و عەشق

لە قۆناغی سەرەتایی
لەبەر خاتری مامۆستایەك
تەباشیر و تەختەڕەشم
زۆر خۆشدەویست،
هەموو ڕۆژێ دوای وانەکان
پاشماوە و پارچەکانم لێ وەردەگرت،
لەناوەندیش عەشقی شیعر و
ڕستە و ڕێزمان
لەمامۆستای کوردی فێربووم،
لەقۆناغی ئامادەیی
هەر لەڕقی مامۆستایەك
دە کتێبی کیمیام سووتاند!
لەحەرەمی نێو زانکۆشدا
خۆشەویستی مامۆستایەك پیری کردم!
ئێستا کە خۆم مامۆستامە
نە تەباشیر ماوە و نە تەختەڕەش
تا تێبگەم چەند قوتابی خۆشی دەوێم
وانەی کیمیاش نالێمەوە

تا بزانم چەند قوتابی ڕقی لێمە!
من مامۆستای هونەریمە
کە سازەکەم لەگەڵ خۆمدا دەبمە پۆڵ
کە شعرێکی تەڕ و ناسك دەخوێنمەوە
هەرچی ڕقی قوتابخانە و ناو پۆڵ هەیە
لەگەڵ یەکەم گۆرانیدا دەیسڕمەوە ..
قوتابیەکان هۆگرم بوون
هەر هەموویان بەیەك ئاواز
گۆرانیەکە لەدوای مندا دەڵێنەوە .

## بەها

لەم سەردەمە
بەها و شکۆی ژن
لەجوانیدا دەبینن
من چەندان فریشتە دەناسم
جوان نەبوون
وەکو دایکم
وەك خەدیجە و مەریەم و ئاسیا بوون!

## جوان و ناشیرین

هەموو ژنە ڕووخسار ناشیرینەکانی
دونیام خۆش دەوێت
چونکە ئەو مامۆستایەی فێری ڕێز و
ڕەوشت و خۆشەویستی کردم
ناشیرین بوو!
ڕقم لەزۆربەی ژنە جوانەکانی
دونیا دەبێتەوە
چونکە ئەو ژنەی بەڵێن و
پەیمانی شکاند و
ناپاکی لەگەڵ کردم
زۆرجوان بوو!

## ڕامان

هێندەم سەیری وێنەکانت کردووە
خۆم بیرچۆتەوە
وەرە بمبینە
ڕێك ڕەنگی تۆم گرتووە .

## فریشته

تۆ خانمی یەکەم عەشقی
دڵی منی
تۆ بەهاری یەکەم وەرزی
ئەوینمی
خۆشەویستی تەمەنی پڕ
سۆزی منی
لەهەر کوێ بی دێمە ئەوێ
تۆ بووی بەمن
منیش بەتۆ
تۆهی منی
چاوی منی
رۆحی منی
تۆ بۆ منی
تۆ شاژن و تۆ فریشتەی
دونیای منی!

## پیرە یار

ئێستاش جوانی
بەقەد جوانی
هەموو ئەو کچ و ژنانەی
دەچنە پێشبڕکێی شاجوانی
پیرە یارم
تۆ ماوی
هەتا ماوی
هێمای عەشق و شیعر و جوانی

## دڵ

چاو دامەخە
لەئاست مندا چاو دامەخە
لەدوای کۆچ و دابڕانت
ژیان یەك پارچە دۆزەخە
لەدوورەوە بۆ لات هاتووم
دەرگای دڵت لێم دامەخە!
لەگەڵ عەشق دۆڕان نییە
وەك پاڵەوان خۆت دەرمەخە!

## ڕووخسار و ماسك

ئەگەر كۆرۆنا و بەستنی ماسك
كۆتایی دێ
ڕووخساری ناشیرینی
زۆر كەست بۆ دەردەكەوێ
هەندێ كەس بۆیە ماسك دەپۆشێ
تا ناشیرینیەكانی دەم و لووتی داپۆشێ!

## دیدار

تا عەشق سەری هەڵنەگرتووە
پێی بڵێین با بێ
لەم مەملەكەتە تۆفانی دابڕان
بەردەوام زوو دێ
پێی بڵێین گەر دێ
وەك خۆی بێ گەرد بێ
لەگەڵ با بابێ
ئۆقرە ناگرم ئەگەر درەنگ بێ
دەترسم تا دێ
ئاخیرەت دابێ

٢٠٢١/١/٢٦

## گەڕان

لەبێ تۆییدا خۆم وونکردووە
نازانم بەدوای تۆدا بگەڕێم
یا خۆم بدۆزمەوە ؟!
لەکوێ بەدواتدا بگەڕێم
لەکاتێکدا خۆت لەناو دڵ و
چاوەکانم وونکردووە!

## خوات لەگەڵ

وەکو گەڵاکانی پایز
ڕۆژ و ساڵی تەمەن وەری
کە ڕۆیشتی و بەجێتهێشتم
بۆت جێ هێشتم تەنها خەم و دەردەسەری
بیست و پێنج ساڵ چاوەڕوانی وا تێپەڕی
لەخەونیشا تەنیا جارێك بەلای مندا تێنەپەڕی
بۆیە ئێستا نە دەمەوێ بتبینمەوە
نە دەشمەوێ بمبینیەوە!

## غەزەلم

غەزەلم دەردی دڵە
قەسیدەم پڕ لەمەبەست
تێدەگەن ئەدیب و شاعیر
قەسیدە و غەزەلییەت

## ڤالانتاین

هەموو ڕۆژێ تۆم خۆشدەوێ
با چواردەی دوو هەر تێپەڕێ
دەتەوێ کەی بێیتەوە
ئەو ڕۆژەی خۆر لە مەغریب دێتەوە ؟

## لێم مەڕوانە

لێم مەڕوانە بە چاوی سەر
تا نەمخەیتە کانگای دڵت
ڕۆژێ سەدجار
لەچاوانتا دەمکەیتەدەر

## دیاری

گوتی ئەمجارە کە هاتی
بۆنێکی خۆشم بۆ بێنە بە دیاری
هەناسەی ڕۆژێکم
لەشووشەیەك کۆکردەوە
گوتم بالات بێ بۆ یادگاری .

٢٠٢١/٣/١٣ هەولێر

## قەرەبوو

کێ قەرەبووی
ئەو فرمێسکە ڕاستگۆیانەی
کچۆڵەیەك دەکاتەوە
کە شەوانە بەدیار
نامە درۆکانی کوڕێك دەیڕشت ؟

## نهێنی

هەمووشەوێ نامەکانت دەخوێنمەوە

چاو بە پیت و

وشە و ڕستەی دەهێنمەوە

دەڵێم بەڵکو لەدێرێکدا

لە قوژبنی نامەیەکدا

نیشانەیەك بدۆزمەوە

هۆکاری ئەم دابڕانەت

لێکدەمەوە .

٢٠٢١/٣/٢١

نەورۆز- هەولێر

## بڕۆ ئیتر

بڕۆ ئیتر نەتبینمەوە

سکاڵای خۆم لای خوا دەکەم

لەقیامەت

ئەو مافەت لێ دەسێنمەوە!

## درکان

بیدرکێنه ئەو وشانەی
بەندن لەنێو دڵ و دەروون
تابزانن ئەم تاوانە
لەئەستۆی تۆیە یا هی من
دڵنیامە بەم ئاواز و
بەزم و ڕەزمە هەڵدەپەڕی
فرمێسکی خەم بەشادیەوە
لەم ئاهەنگە بەمن دەسڕی
ئێستا لەوێ
دەستت لەنێو دەستی زاوا ناوە
چاو دەگێڕی و نزا دەکەی
دەرنەکەوم من لەم ناوە
لەئاهەنگی گۆڕینەوەی ئەڵقەی پەنجە
سەر هەڵبڕە
نمایشی عەشقی درۆت کۆتایی هات
پێبکەنە
دڵنیامە ئێستا لەوێ ئاهەنگێکی ڕازاوەیە
خواردنەوەتان سەربەکەف و هەمەڕەنگ و ناوازەیە

## خەڵات

تۆ دەروازەی عەشق و جوانی ڕۆژهەڵاتی
لەگەڵ یەکەم گزنگی خۆر
پڕم دەکەی لەدڵسۆزی
ئاسوودەییم پێ دەبەخشی
تۆ گەشبینی و تۆ بەهاتی
تۆ پردی پەڕینەوە و
کەشتی نەجاتی
تۆ گوڵشەن و تۆ شاگوڵی
پڕ بەهاترین خەڵاتی

## باران

ئیستاش کە باران دەبارێت
چەترەکەمت بۆ هەڵدەدەم
نەوەك خۆت و
کتێبەکانت تەڕبێت .

## دڵم بێنەوە

ئەمشەو بڕیارە بمرم
توخوا دڵم بێنەوە
دڵ سپاردەی خودایە
دەبێ بیگەڕێنمەوە

## نیفاق

وەکو بەهار خۆت دەردەخەی
کەچی ناخت پڕ پایزە
لەداخی ئەم نیفاقەی تۆ
عەشق لێیان تورە و زیزە

## سینەی گوڵ

بۆ ئەوەی سینەم
هەردەم گوڵ بگرێت
بۆنی هەناسەت
با لێم دانەبڕێت

## من دەمەوێ

من دەمەوێ لەگەڵتابم
لەنێو ترپەی دڵتابم
لەوەرگرتن و دانەوەی
هەناسەتدابم
لەنیگا و تێڕوانینەکانی چاوتابم
لەخەندە و پیکەنینتابم
لەفرمێسك وگریانتابم
کەخەوتیشی
لەخەونی بەردەوامی
ژووانی عەشقت دابم

## نیگا

دەرفەتمدە
عەشق لەچاوانتا بخوێنمەوە
بەزار دەڵێی ڕقم لێتە
کەچی چاوت هێمای ترم بۆ دەردەخات
وەك گەواهی
دەڵێ زارم لەبەرامبەر عەشقی تۆدا
درۆ دەکات!

١٣,٤,٢٠٢١

## ئومێد

کەی تێتبگەم
کەی پێتبگەم
لەکاتێکدا پەنجا ساڵە
لەخۆم ناگەم
بەخۆم ناگەم
هەر چەند دەکەم
پێ ڕاناگەم!

## شکان

هێندەت دڵم شکاندووە
کەس ناتوانێت کۆمکاتەوە
مەگەر هەر خۆت
بەفرمێسکی پەشیمانی
پارچەکانم لێکدەیتەوە!
ناتخۆمەوە وەك قاوەیەك
نە بەتاڵی نە شیرینی
نەوەك ڕۆژێ لێم بڕەنجێی
ناچارم کەی بتهێنمەوە

## نازی عەشق

نە بەرگەی دووری و دابڕان دەگریت
نە نازی ڕازی عەشقم هەڵدەگریت
بۆ ژووانی من باڵی مەل دەگریت
لەدیداریشما دەستم ناگریت
کەجێشت دێڵم بەکوڵ بۆم دەگریت
تاوانی خۆتە یەخەی من نەگریت
ڕێزی تەمەن و ڕیشم ناگریت
عەشق بەم شێوە قەد سەرناگریت

## قوربانی

لەپێناوی عەشقی تۆدا
چی نەماوە لەدەستی دەم
چەند ساڵێکی تەمەن ماوە
ئەویش بەقوربانت دەکەم

## گۆڕان

نامەیەکت لامە
بەدەست و پەنجەی خۆت
نوسیوتە(خۆشم دەوێی)
ناکا بیرت چووبێتەوە
ڕۆژگار هەڵوێست و کەسەکان دەگۆڕێت
بەڵام یادگارییەکان
وەکو خۆی دەمێنێتەوە!

## ملوانکەی شیعری

کەی دێیتەوە و
لەبری زێڕ و مرواری
ملوانکەیەکی شیعریت لە گەردەنکەم ؟

## ڕەنگ و بۆنت

ڕەنگ و بۆنت لەگوڵ دەکا
من نازانم
گوڵ فرۆشی
یا گوڵ شێوەی لەتۆ دەکا؟

## سروشت

ئەو دەمەی دڵم تۆی دەویست
دونیام دەکردە قوربانیت
ئێستا بەهەشتیشم پێ دەیت
وادەزانم تۆ هەر نەبوویت!

٢٤،٦،٢٠٢١
پارکی کانی

## ئاوازی عەشق

عەشق گۆرانییەکە
هێشتا هۆنراوەکەی نەگوتراوە
ئەوین ئاوازێکە
کەس بوێری ژەنینی نییە
چونکە هێشتا نۆتەکانی نەنووسراوە
هێشتا دەنگێك نەیچڕیوە
کەتۆش جارجار دەنگێك بەگوێچکەما
دەچرپێنی لێی تێناگەم
دڵنیامە دڵسۆزییە
نهێنی ئەم سروودە نادرکێنم

## ئیرەیی

دوێنێ چوومەوە باخی شار
بەدوای ئەو درەختەدا گەڕام
کە لەژێر چەترەکەیدا
بۆ یەکەم جار خۆشەویستی
خۆت بۆم  درکاند
گەڕام، گەڕام ...
ئەم لا، ئەولا
گوتیان دوێنێ شارەوانی
لە ڕەگەوە هەڵیتەکاند
گووتم بۆچی ؟
گووتیان بۆنی عەشق و
ئەوینی لێ دەهات
دارەکانی دەوروبەری
ئیرەییان پێ دەهات
سکاڵایان لەدژی دا
سێبەرەکەی
وێنەی ژنێکی باڵاپۆشی دەنەخشاند

٢٥,٦,٢٠٢١
پارکی سامی عبدالرحمن هەولێر

## لەیادت بم

دەروێشانە ڕێچکەی عەشق و
ئەوین دەگرم
لەپێناوت
ڕۆژێ سەدجار دەژیم، دەمرم
من دەمەوێ لەیادت بم
وەك چۆن تۆ هەردەم لەیادمی
بمخە نێو هەناسەکانت
تۆ لەترپەکانی دڵمی

## سەری ساڵ

ئەو ڕۆژە جەژن و سەری ساڵمە
مەعشوق لەدڵ و لەخەیاڵمە
سەری ساڵی چی
یاد و خۆشی چی
کە یار لێم زیزە
یاد و بۆنەی چی ؟

## مانگ

وەکو مانگ دوو ڕووین
ڕووێکمان ڕووناك
ڕووێکمان تاریك

## لەپایزدا

کە عەورەتی درەختەکان دەردەکەوێت
خەتای بایە
نەوەك گوناهی گەڵا و دار

## سوڵح

وەرە با ئاشتبینەوە
بەهەموو تاڵیەکانتەوە
لەشیرینی خەڵکانی تر خۆشتری
وەرە بگەڕێوە تۆم قبوڵە
بەهەموو ناقبوڵیەکانتەوە
وەرە با ئاشتبینەوە
بەهەموو خراپیەکانتەوە
لەچاکی خەڵکی تر باشتری

## چرا

ببە بە من
وا بەستەی خۆتم کە
لەتاریکیدا چرام بۆ هەڵکە
لەڕووناکیدا چاوساغم بە
لە وون بووندا ڕێ نیشاندەرم بە
لەعەشقدا ئاسوودەم کە
لەدابڕانیش هەر لەگەڵم بە

## بۆڵە

من دەمەوێ
لەنێو پرچی هەورێکی ڕەش
ئارام بنووم
کەهەڵساشم بۆڵە نەکات
وەك هەندێ ژن
بڵێ پرچم تێك ئاڵاوە
لەبەر خەوت
من نەخەوتم!

٣,٩,٢٠٢١ هەولێر

## دڵسۆزی

هێندە ئەمەکی مەنوێنە
گومان لەدڵسۆزیت دەکەن
سواڵی عەشق لەکەس مەکە
بەئاسانی وونت دەکەن
دابڕانی بێ هۆ سەختە
مردنێکی لەناوەختە
هەندێ کەس ئەزموونیان هەیە
گاڵتە بەهەست و سۆز دەکەن
ئەو تەمەنەی بەفیڕۆ چوو
کێ قەرەبووی دەکاتەوە
ئەومتمانەی لەدەستتدا
هیچ کەس بەتۆی ناداتەوە

## تەریقەت

خەڵك دەبێتە سۆفی
دەستی شێخی ماچ دەکات
من موریدی عەشقی تۆم
ڕێ نادەم کەس ماچت بکات

٢٦,٨,٢٠٢١

## نەهات

هەموو شەوێ ئێشکگری
تا بەیانی لەگەڵ فرێند لەسەر چاتی
کەچی بۆمن وەکو وەرزی وشکەساڵی
هەرنەبوونی و
هەر نەهاتی

١٥,٧,٢٠٢١

## ڤاکسین

عەشق لەم سەردەمە
وەکو کۆرۆنایە
تا نەتگرێ
ڕاستگۆیی درۆکانیت بۆ دەرناکەوێ!
ماسکەکەت هێشتا هەر لامە
بۆنی هەناسەتی لێ دێ
قەد تووشی کۆرۆنا نابم
لەبری ڤاکسین بەکاردێ

## وون بوون

من شارەزای کۆڵان وگەڕەکی ئێوەم
بست بە بستی
هێندە هاتم
هێندە گەڕام لێتم پرسی
لێم بێزاربوون خەڵکی گەڕەك
گووتیان ئەرێ تۆ سواڵکەری، شێتی، برسی ؟
ئیتر بەسە ڕەزاقورسی
گووتم نارۆم یەخەی ئێوە قەت بەرنادەم
تا پێم نەدەن ناونیشانی
یا ئەدرێسی!

٢٢,٧,٢٠١٢

## داوا

من رۆحم لەتەمەنی پەپولە ناسکترە
ئەو چرکە ساتانەی پێکەوەین
ئاگات لەهەستەکانم بێ
بەرگەی کۆستی تر ناگرم
لەم تەمەنە کورتەی عەشقا
پەڕەی گوڵالەم لێت دەوێ!

## چاوەڕوانی

ئەمشەویش دێم
لە بەرامبەر ماڵەکەتان
تا بەیانی ئێشك دەگرم
چرای ژوورت مەکوژێنەوە
پەنجەرەکەت لێم دامەخە
دواتر لێرە
بەبێ دەنگی لەم سەرمایە
تەنیا دەمرم!

## ئاشتی

جگە لەتۆ
کەس ناتوانێت
پارچە شکاوەکانی من کۆکاتەوە
کە توڕەبووم
یاخود ڕەنجام
بەسڵاوێك، یا نامەیەك
هەر زوو ئاشتم بکاتەوە .

٢٤,٨,٢٠٢١

## ئاواز

لەژێرسێبەری ئەم دارە
ئاوازێکم بۆ تۆ ژەنی
نیگاێکت بۆکردم و
لام دانیشتی و پێم پێکەنی
ئەو شیرینیەی پێمت بەخشی
هەموو گیانمی کردە خۆشی
لەچاوانتەوە خوێندمەوە
جارێکی تریش دێیتەوە
من لەو ساوە چاوەڕێتم
هەمان ئاواز دەژەنمەوە
چاو دەگێڕم
بەم لا، بەو لا
دەڵێم ئێستا وەك فریشتە
دیسان دەردەکەوێتەوە
دە دەرکەوە
دەست و پەنجەم
لەعودەکەم نابێتەوە!

٣١,٧,٢٠٢١

## سۆڤا

ئەمشەو دیسان هاتیە خەونم
بەئەسپایی دوا پەیامی خۆت پێ گووتم
بار و دۆخی ئەم سەردەمە
چەند دژواربێ
پێچەوانەی خۆشەویستی من و تۆ بێ
بەربەستەکان هەزار هێندە
زێدەتربن
دڵنیابە جێت ناهێڵم
دەست لەعەشقی تۆ بەرنادەم!

١٦,٧,٢٠٢١

## سۆڤا

بە ڕادەیەك خۆشم دەوێی
ڕقم لەخۆم دەبێتەوە
لەبەر بیر و خەیاڵی تۆ
خەریکە خۆم بیرچێتەوە
من بەو جۆرە عاشقی تۆم
دڵم بەتۆ دەکرێتەوە
تۆش عیناد و بێ ویژدانی
ئاوڕ لەمن نادەیتەوە!

٢٧,٨,٢٠٢١

## سۆڤا

بەر لەبانگشەی هەڵبژاردن
من دەنگم بەکاندیدی خۆمدا
لەسەر گەڵاکان ناوم نووسی
داومەتە دەست کۆمسیۆنی (با)

## سۆڤا (کۆتایی)

ئیتر شەوان خەون بەتۆوە نابینم
نەك لەخەونا
لەڕاستیشدا
من نامەوێ تۆ بینم
شەوان بەدیار نامەکانت
ئێشکگ ناگرم
ئیتر خۆشم ناوێی
لەبەرت نامرم!

## شێت

ئەگەر ڕۆژێك منت بینی
لەناو بازاڕ و باخی شار
بەپێ خواسی و جل دڕاوی
پیس و چڵکن، سەر قژناوی
شۆك نەتگرێ
پێم نەگووتی وام لێمەکە
دواتر عەشقت شێتم دەکا ؟

## پەیمان

ئەو شەوانەی بێ تۆم
جگە لەمردن چیتر شك نابەم
ئەگەر سبەینێ نەمردم
بەیانیم بەزیندوێتی کردەوە
یەکەم کارم
ناردنی نامەیەکە بۆ تۆ
تێیدا سۆز و
پەیمان و خۆشەویستی
دووپات دەکەمەوە!

## شکان

لەتەمەنی زێرینی خۆم
کەس نەیتوانی بمشکێنێ
تەنها عەشقت
لەخاچی دام
بەشێوەیەك ووردی کردم
بۆ حەوت پشتم بمشێوێنێ!

## بڵێ لێرەم

وەرە نیشتەجێی چاوم بە
خۆ تۆ لەخۆم گرنگتری
لەنێو دڵم هەڵت دەگرم
تۆ لەمن زۆر شیرینتری
ناوت لەسەر لاپەڕەی
گشت کتێبەکانم دەنووسم
کەدەستم برد بۆ هەرکامیان
بێیتە پێش چاو
بڵێی لێرەم هەموو کەسم!

٢٢,٨,٢٠٢١

## بڕیار

ئەمشەو بڕیاری کۆتایی
لەسەر مەرگی خۆم دەدەم
بەناچاری دەست لەعەشقی
تۆ بەردەدەم
چیتر مەڵێ :
بەس تۆ بلێ من بۆ تۆ هەم!

## بڕیار

خۆم لەتۆدا وونکردووە
نە ئامادەی بۆ خۆتم بەی
نە دەشتەوێ بمدەیتەوە
عەشقت هەر وەی
دووریت هەر وەی!
بڕیارم دا بەخۆم بچم
ئیتر بەدوای کەسدا نەچم
خۆم نەکەمە قوربانی کەس
بۆ خۆم بژیم، هەر خۆم و بەس .

## ئەگەر

ئەگەر بەیانیت کردەوە
هەواڵی تۆم نەپرسی بوو
لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا
بەیانی باشم نەکردبوو
نامە و زەنگی مۆبایلت
ناوی منی لەسەر نەبوو
دڵنیابە
یان من مردوو
یان تۆ لەدڵی من مردوو!

## بانگەشە

لەهەڵبژاردنی عەشقدا
بەربژێری دڵی منی
لەسندوقی دەنگی دڵی تر
تۆ هەژمار نی کەسێکی وونی!

## ئاوێنە

بۆ بینینی خۆت لەمندا
وەك ئاوێنە لێم بڕوانە
گەر خۆت لەمن نەدۆزیەوە
دڵنیابە ئەم ئاوێنە
هەر شایستە بەشکانە!

## دێمەوە

لەدەرگای ماڵتان دەرمکەن
لەگەڵ تیشکی خۆر دێمەوە
دەروازەکانی چوونە لات
بەڕووی مندا داخەنەوە
لەپەنجەرە شکاوەکەت
سەر لەعەشقت دەدەمەوە
کامێرای چاودێری دانێن
خۆم دەکەمە سێبەری با
لەکەلێنی پاسەوانی دەپەڕمەوە
گەر بەشێوەش بمناسنەوە
نەشتەرگەری ڕووخسار دەکەم

هەزار باجی قورسیش بدەم

هەر بەعەشقت دەگەمەوە

بەدیدارت شاد دەبمەوە

٣٠,٨,٢٠٢١

## قەرز

ئەو هەموو خەندە و پێکەنینە

لەکوێ بێنم بدەمەوە؟

ئەو فرمێسکە ڕاستگۆیانەی بۆت دەڕشتم

چۆن بۆتی بگەڕێنمەوە

ئەو تەمەنەی لەگەڵ مندا بەفیرۆتدا

چۆن قەرەبووی بکەمەوە ؟

ڕۆژێ سەدجارخۆت دەکردە قوربانی من

ئێستا کەتۆ لەمن وونی

خۆم بکەمە قوربانی کێ ؟

بڵێم قەرزم داوەتەوە ...

بەقەد گەڵاوەریوەکانی پایز خەجاڵەتم

کە ناتوانم بەهارت بۆ بهێنمەوە!

٢١,٩,٢٠٢١

## مەقامی عەشق

تۆ لەئاوازێکی بەیات دەچی
ڕاستە و ڕاست لەخۆتەوە هەڵدەچیت!
کەس ناتوانێت بڵێت بۆ کوێ دەچیت
سەرم سوڕماوە لێت، ئەرێ تۆ چیت!؟

## دڵسۆزی

جگە لەمن
کەس هەواڵی تۆ ناپرسێ
کەسێ نییە لەوون بوون و
دابڕانی تۆ بترسێ!
زۆرجار دەڵێم
دەبێ ئەویش بەئەندازەی خۆشەویستی و
دڵسۆزی من
بەئەرکی عەشقی خۆی هەڵسێ ؟

## جلی مۆده

ئێوارەیە ....
بەڵام جیاواز
لەهەموو ئێوارەکانی تر،
ئیتر سەیری کاتژمێرکەم ناکەم ...
چرکە و خولەکەکانی ناژمێرم
گوێم بۆ زەنگی مۆبایل و
نامەکانی ڤایبەر شل ناکەم،
ئێوارەیەك پڕ لەتەنهایی
چونکە دەزانم ئیتر تۆ نایەت ...
لەگەڵ خۆتدا
جوتێ لێوی سوری تەنك
جوتێ سێوی سەوزی سینەت
بۆنی عەتری هەناسەت و
ماچێکی تەڕی پڕ عەشقت ناهێنیت!
هێندە پەلەی ڕۆیشتنت لەکوێ هێنا ؟
کێ بوو دەیگووت:
من هەردەم هەم ؟
خۆ من هێشتا
لەڕوانینی چاوی ڕەشت،

لەڕووخساری پڕ لەسیحری جوانی هەستت،
لەتوڕەبوون و خەندە و پێکەنینت،
لەدیداری ناز و لەنجەت هەر تێر نەبووم
بەڵێنی ساڵێکت پێدام
کەچی سێ ڕۆژ بەرگەت نەگرت
عەشق و ڕێز و خۆشەویستیت
بەجلێکی ڕووتی بێ گیانی بووکێنێت گۆڕیەوە
خەونی پێکەوەبوونی تەمەنت
لەهزری مندا سڕیەوە! ٢٥,٩,٢٠٢١

## ژن

بۆ هەر شوێنێ سەر هەڵگرم
لەنێو پێلوی چاوەکانما هەڵتدەگرم
لەگەڵ هەر تروکانێکدا
یادت بکەم، وێنەت بگرم
لەبەرامبەر چاوی تردا
سەرداگرم، چاوم بگرم
من بەو شێوە
ڕێز لەژنی دڵسۆز دەگرم .

## گوڵ بانه

تۆ ئاوازێکی
مۆسیقایەکی بێ نۆتەی
جگە لەمن
کەس لەم گۆرانیەی تۆ ناگات!
ڕۆژێ سەدجار گوێت لێ بگرم
لێت تێرنابم
تۆ کۆتایی ئارامییت و
دەست بەرداری عەشقت نابم

## هاودەم

من پایزی تۆم پێ خۆشە
نەك بەهاری کەسێکی تر
گریانی تۆم لا خۆشترە
لەئاوازی دەنگێکی تر
ئەم ئێوارە چۆن بەرێکەم؟
لەم شارەدا هەر خۆم و خەم
کەسێ نییە دەستم بگرێ
وەکوهاوڕێ، وەکو هاودەم .

٣،١٠،٢٠٢١

## چیرۆکی عەشق

عەشقی ئێمە
چیرۆکێکی دوور و درێژە ....
کەس ناتوانێت بینووسێتەوە
مەگەر بەختیارعەلی
سەرەتای ناسینمان بکاتە چەند ڕۆمانێك
بۆ ئەوەی ناوەڕاست و
کۆتاییەکەی بیرنەچێتەوە!

## یەکەم ناسین

کەی دێیتەوە ؟
بەم زستانە دوو چای گەرم،
لەم کتێبخانەی تۆم ناسی
بخۆینەوە،
بەرامبەرم دابنیشی ....
پڕ بەهەستم لێت بڕوانم،
شیعری تەڕ و
ناسکت بۆ بخوێنمەوە ؟

١١,١١,٢٠٢١
کتێبخانەی ئاشتی، هەولێر

## چاوەڕوانی

گووتت گەر باران بباریٚ
دیٚمەوە دیدارت جاریٚ
ئەمرۆ خۆ لافاویش هەڵسا
شاریش خرۆشا بەجاریٚ
چاوەڕیٚ بووم گووتم وا دیٚ
هەر نەهاتی تۆ بەجاریٚ

## چاوەڕوانی

کەس ناتوانیٚت بیٚتە دڵم
جیٚگەتـقەت پڕ نابیٚتەوە
ئیٚستاش چاوم هەر لەڕیٚیە
دەڵیٚم ڕۆژیٚك هەر دیٚیتەوە .

## درۆی عەشق

دەڵێن عەشق

پیاوی ڕاستەقینەی دەوێ،

من خۆم لەعەشقی تۆ بینی

کەچی تۆ هەر منت ناوێ

منیش ئیتر بڕیارمدا

لەپیاوەتیم بتسڕمەوە

نە تۆ نە عەشقی تۆم ناوێ

##ماڵئاویی

تنۆک، تنۆک

عەشقت دەتکایە نێو دڵم

لەگەڵ نمەی باران و...

پروشەی بەفردا

هێدی، هێدی

دەڕژایتە نێوناخم،

ئاسمان و ئەستێرەکان ...

کانی و ڕووبار و دەریاکان،

شەونمی سەر گیاکان و
گەڵای درەختەکان و
کوچە و کۆڵان و
شۆستە و شەقامەکانی شار،
باخچە و پارك وكافێ و چێشتخانەکان،
هەتا چۆلەکە و کۆترەکانیش
گەواهی ڕاستی و دڵسۆزی
خۆشەویستی من دەدەن .
ویستم بەرۆژ ئاسودەت کەم
بەشەو ئارامی و
بەختەوەریت پێ ببەخشم
ویستم بتکەم بەپەیکەری ئەوین
لەناوەندی گشت شارێکدا هەڵتواسم
لە تابلۆیەك
بەئاڵتونی گران بەها
بەمرواری وگەوهەری نەبینراو
نمایشت کەم
نەتویست!
دەستت گرتم

ڕێت لێ گرتم
بەخەت گرتم
لەهیچ وخۆڕا
مالئاواییت لێ کردم .

١٢,١١,٢٠٢١
کتێبخانەی ئاشتی

تەبا

کە بێ دەنگی
کە کڕی
دەمسووتێنی تۆ ئاگری
تۆ گڕی!
هێندەم خۆشدەوێی
حەزدەکەم بەدەستی خۆت سەرم بڕی
بیست و پێنج ساڵ وا تێپەڕی
هەر نەهاتی
ئەشکی دابڕانت نەسڕی
چ مەعشوقێکی بێ بەزەیی و پڕ ڕقی
بەرامبەرم سارد و سڕی
جەرگ بڕی .

## ئاوات

بیرتە دەتگووت :
شێتۆ نەڕۆی
من شێتم دەبم گەر تۆ بڕۆی
نەڕۆیشتم
جێم نەهێشتی
جێت هێشتم و تۆ ڕۆیشتی
ئێستا لەمانگی هەنگوینی
لەسەیران و بەزم و گەشتی
بەئاواتی خۆت گەیشتی
عەشق وشێتیت جێ هێشت بۆ من
سەد مخابن!
دوو ڕۆژی تر
دەبیە دایك
دەبیتە ژن!

١٤,١١,٢٠٢١
سپێدە
هەولێر

# ژياننامەی شاعير

**محسن حمدامين حسين ناسراو بە (موحسين شوانی)**

- لەساڵی ١٩٧١لە قەزای مەخموور هاتۆتە دونیاوە.

- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی لە مەخموور تەواوکردووە.

- دبلۆمی لە ڕاگەیاندن وەرگرتووە.

- زیاتر لە ٢٠ساڵ خزمەتی مامۆستایەتی هەیە.

- لەساڵی ١٩٨٤ دەستی بەشیعر نووسین کردووە و یەکەم شیعری لەساڵی ١٩٨٧لە گۆڤاری کاروان بڵاوکردۆتەوە.

- تا ئێستا ١٠ بەرهەمی شیعری بەچاپ گەیاندووە.

- جگە لەشیعر لەبوارەکانی هونەری میوزیك و شانۆ و ڕۆژنامەنووسی و ڕاگەیاندن کاردەکات.

- ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە.

- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی کوردستانە.

- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە.

- هەشت ساڵ پەیامنێری کەناڵی ئاسمانی سپێدەبووە.

- لـه زۆربــەی ڕۆژنامــه وگۆڤــار و ســایتەکان شــیعر و وتــاری بڵاوکردۆتــەوە.

بۆ خوێندنەوەی زیاتر و ئاشنابوون بەشیعر و بەرهەمەکانی:

Facebook\ muhsin shwany

Instagram\ muhsin shwany

Youtube\ muhsin shwany

Twitter\ muhsin shwany

Phone\ 07504787213

# بەرهەمەکانی تر

١. هەواڵی زیندان ٢٠٠٣

٢. ملیۆنێک و هەشت سەد هەزار واژوو ٢٠٠٤

٣. هەڵەی مێژوو ٢٠٠٥

٤. سێبەری پاشخانی کورد ٢٠٠٥

٥. تەقینەوە ٢٠٠٧

٦. ئابڕووی هەژدە خونچە ٢٠٠٧

٧. تەنها محمد ٢٠٠٩

٨. دیواری دەسەڵات ٢٠٠٩

٩. بەهای تەمەن ٢٠١٩

١٠.عەورەتی نیشتمان ٢٠٢٢

## سەرۆکی عەشق

تۆ بەهاری
بۆ پایزی دڵەکەی من
ئەی جوانترین بەخششی خوا...
ئەی فریشتە
لەوێنەی ژن!
گەرچی لەپێش چاوی خەڵکی
لەسەر کورسی دەسەڵاتی
عەشقم وونی
کۆشکی پاشای ئەوینداری
هەر لەخۆت دێ
تۆ شاژنی
حکومڕانی مەملەکەتی دڵی منی!

بەرگ: محەمەد جەبار